هەروەها شاعیر نوقلانە بۆ دەرچوون و بڵاوبوونەوەی هەردوو گۆڤاری (گەلاوێژو نیشتمان) لێ دەدات و دەڵێ:

لــە شــەوقی نیــشتمان و شــوعلەی ئەســتێرەی گەلاوێــژە
برینــی رووح و قــەڵب و قــاڵبم فیلجوملــە ســارێژە
ئەگــەر بــاوەر دەکــەن یــاران ســەدای تــەپڵی بەشــارەت دێ
مــەڵێن ئــەم شــاعیرە دێوانەیــە یــا شــێتە یــا گێــژە
دەڵــێن ئــەو کــاروانی قافیلــەی کــوردی وەپــاش کــەوتوو
کــەمی مــاوە نــەجاتیان بــێ لــە ئــەم هــەورازو ئــەم لێــژە

ئەو بانگەوازەی شاعیریش لەکاتی خۆیدا (برا بییری چراییکی بکەن بیکەن بە جەمهووری) هەتا لەپێش پێکهاتنی کۆماری کوردستانیشەوە بووە، وەکو دروشمێکی زیندوو لە دڵی مێژوودا ماوەتەوە وەك مەشخەڵێك بۆنەوەکانی دوای خۆی، کاتێ دەڵێ:

لــە رۆژنامــەی مــودیری کــە چ مــەداری چــەرخی شــەفتووری
ئەنوســێ رۆژی کــوردی کەوتــە ئــەوجی بــورجی بــێ نــووری
بــرا بــیری چــراییکی بکــەن تاریکــە شــەو دادێ
قیــامێکی بکــەن تــا فرســەتە بیکــەن بــە جــەمهووری
کەســێ میللــەت پەرەســت و خــاوەنی فکــرو سیاســەت بــێ
تــەرەققی میللــەت و ئاسایــشە مەقــسوودو مــەنزووری
یــەقینت بــێ لــەباوەش نــاگری قــەت شــاهیدی مەقــسوود
هــەتاکو پــێ نەنێتــە مــوڵکی ئــازادی بــە مەســرووری

گ/ نیشتمان، ژ/ ٥: ٢٠

## باسی دووەم

## ناوەرۆکی شیعری سەیفی قازی

سەبارەت بە ناوەرۆك مەبەستەکانی شیعری سەیف لە مێژووی ئەدەبی کوردیی د. خەزنەداردا هاتووە: (بەشێك لە مەبەستەکانی شیعری کلاسیکی شاعیر لەگەڵ هەندێ ناوەڕۆکی نوێ بە جووتە لە شیعریدا رەنگیان داوەتەوە، ئەو لەسەر رێگەو شوێنی کۆنەکان نەرۆیشتووە بەڵکو زۆربەی مەبەستەکانی تێکەڵ بە یەکتری کردووە، لەمەدا کارێکی باشی کردووە چونکە لەگەڵ رێبازی شیعری ئەو دەمە رێك کەوتووە بەوەی مەبەستی شیعری لە قاووغی تەسکی چوارچێوەی کلاسیکی دەرهێناوەو بەشێوەی لیریکی تازە بابەت خستوویەتیە روو).[4]

**١. شیعری ئاینی:**

شاعیر لە ستایشی پەروەردگاری مەزندا دەڵێ:

بۆ تۆیە هەر بە تۆیە دەتوانم بکەم سەنا
رۆژو شەوێ تۆ دێنی دەبەی مەغریبو عیشا
گەورەو گرانو بێ کەسو بێ جێو بێ مەکان
بۆ بێ کەسان کەسی بۆ بێ جێیەکان پەنا
تەنهاو بەر قەراری هەر بوویو هەر دەبی
بێ ئارەزوو و نیازی، بێ بابو بێ برا
بێ وێنە سانعێکی بە ئەمرێ دروست دەکەی
ئینسان لە ئاوو گوڵ لە گەڵاو لە گڵ گیا
هەرچی پەڕی گوڵانە لە بۆ زیکری تۆ زمان
هەرچی گەڵای بەدارەوە، دەستن لە بۆ دوعا

دیوان: ٢٤

---

(4) مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٥: ٣٤٥.

له خۆشەویستیو نەعتی پێغەمبەردا دەڵێ:

بەخـــسووس شـــەفیعی ئێمەیـــە ئـــەو خۆشەویـــستەکەت
شـــابازی دەشـــتی مـــەروە، شـــەهی شـــارەکەی ســـەفا

هـــەردەم ســـەلاتی زۆرو ســـلاوێکی بـــێ ئـــەژمار
دیـاری بـێ بـۆ رووحـی پـاکی تـۆ ئـەی فـەخری ئـەنبیا
مەقـــسود لـــە خـــەڵقی عالەمـــە هـــەر زاتـــی پـــاکی تـــۆ
خـــەڵکی هـــەمووی توفـــەیلی هـــەر تـــۆی کـــە بـــانگ کـــرا
چـــوونە حـــووزورو هاتنـــەوەت لـــەحزەیێکی گـــرت
لـــەو جێگـــەدا مەلـــەك بـــە گـــەلێك کەتنـــە دوا
هاتوچـــو، بیـــستی، کـــوتی، زوو گەڕایـــەوە
ئالقـەی دەرهـەر دەلـەرزی، چـرای مـاڵی هـەرگرا

سەیفی قازی موریدو مەنسووبی شێخی بورهان بووە، لەوبارەوە لـە پێشەکی دیوانی سەیفدا هاتووە: (هەموو ساڵێك بۆ ماوەیەك خۆی گەیاندۆتـە خانـەقای شـەرەفکەندو ژیانێکی پڕ لە چلە کێشیو عیبادەتی رادەبوارد، خانەقا بۆ ئەو شاعیرە سـەودا سـەرە رووگەی هیـواو هومێدو جێگای خـۆڵ مـاڵ کردنـی گیـانو لابردنـی ژەنـگو ژاری دڵ بوو).[5]

شاعیر سەبارەت بە پایەو مەقامی ئەو پیاوە وەلیو خواناسەدا دەڵێ:

ئەگـــــەر دەتـــــەوێ دنیـــــاو قیامـــــەت
رووی خـــۆت لـــەو دەرکـــە قـــەت وەرمـــەگێڕە
هـــەر کـــەس دەپـــەنای شـــێخی دانـــەبێ
حییـــزی نەفـــسیە شـــەیتان پێـــی فێـــرە
هـــاتنی ئـــەو دەرکـــەوت قـــەت لـــە دەس مـــەدە
ســـەرو مـــاڵی خـــۆت بێـــرە بـــسپێرە
نێـــوی شەمـــسەددین رۆژە کـــە هەڵـــدێ
هـــەر وەك چەکـــچەکی هەڵـــدێ ئـــەو کـــوێرە

دیوان: ٤٩

---

(5) دیواني سیف القضات: ١٧.

### ٢. شیعری دڵداریو جوانی

مەبەستی دڵداری لە بەرهەمی شاعیر دوو ڕێچکەی وەرگرتووە، بەم شێوەیە:

أ. غەزەل/ شاعیر لە هونەری غەزەلیاتدا هەر لەسەر ڕێوشوێنی قوتابخانەی شیعری کلاسیکی کوردی ڕۆیشتووەو لەم مەیدانەدا شاگردی نالیو وەفاییە.

دەبا ساتێکی ساکیت بێ لە ناڵین قەلبی خوێنبارم
دەبا تاوێکی فاریغ بێ لە گریان چاوی غەمبارم
هەتاکەی غەرقی سێلاوی سریشكو ئەشكی خوێنین بم
دەبا جارێك بە گۆشەی چاوی مەیلێکی بکا یارم
دەرم کەی گەر لەلای خۆت یا جوێنم پێ بدەی ناچم
بە زنجیری دوو گیسوت چونکە پابەندو گرفتارم
بە نای ناڵەو بە سینەی چەنگو تاری غەم موهەییا بووم
بڵێن بۆ سەیری ئەو بەزمە دەمێك باوا بێ دڵدارم

دیوان: ٤١

لە شوێنێکی دیکەدا شاعیر لە ڕەنجو دەردی دڵداری دەدوێ:

قەدی یا سەروی جۆباری ئەتۆ ئەی زولفی لاولاوی
سەراپا حەڵقە حەڵقە وا لە بالای بەرزی هالاوی
هەموو گیانم برینداره بە حەملەی تیپی موژگانی
دڵم شەیداو پەرێشانه لەتاوی زوڵفی شێواوی
خراپم کرد روحو ماڵم، دڵم دانا دەپێناوت
دەسا قوربان بفەرموو بۆچی ئەمڕۆ لێمە تۆراوی
کەلامو عیشقی تۆ بوو باعیسی مەشهووری حوسنی ئەو
کەچی ئێستا وەکو زوڵفی لەبەر پێدا فڕێ دراوی
لەبی وەك قەندی شیرینه، جەبین وەك عەقدی پەروینە
دو کوڵمی لالەیی حەمرایە، روی وەك تیغی خوێناوی

دیوان: ٤٢

ب. ليريكی دڵداری خۆماڵی/

هەندێ لە شیعرە دڵدارییەكانی شاعیر لەسەر شێوەی ليريكی جوانیو ئەڤینو دڵداری خۆماڵین، هەم لەباری كێشو مۆسیقاوە هەم لە رووی زمانی كوردی پەتیو شێوازی كرمانجی خۆماڵییانەی ناوچەی موكریان، ئەم ليريكانە سوارو پاراوو بە ئاهەنگن، وەسفی جوانیو دلگیری یارو دڵبەریش بە وێنەو گوزارەی روونو پاراو خراونەتە روو:

كوڵمە سوورەكەی گوڵە مێلاقە
لە دەوری خاڵان بەرێز بزمێرە
زوڵفی وەك شەوەی رۆژی كردمە شەو
چرای سەر كوڵمەم لە بۆ رادێرە
لە باغی حوسنت وەختی زەكاتە
فەقیری خۆتم هەر بۆ من خێرە
بە رستەی زوڵفان دڵم نێچیرە
لە دارو بەردی بەس دە، مەیگێرە
هەر ناڵەی منە لە دۆڵو نوالان
نەك فیتەی شوانو دەنگی بلوێرە

دیوان: ٤٨

لە وەسفی جوانیو نازداری شەنگە بێریو كابانو كیژانی خاتوونی لادێی كوردەواریدا دەڵێ:

لە دەوری سەریان دەسڕۆكەی هەوری
وەك مانگی چاردە لە نێوان هەوری
كەوتە سەر پیلان چارەكەی نوێژی
كە شەهەوری كرد لە دەوری رۆژی
دەسماڵی ملیان پشتێندی شلیان
چنارو لاولاو چاوی بە كلیان
زوڵفان لەسەر شان تێك چڕژان پڕژان
لەشكری چینو ژاپۆن تێك رژان
زوڵفان لە دوویان وەك رەشمار دەخشان
شەو نین وەك شەوە بە رۆژ دەدرەوشان

### ٣. وەسفی سروشتی کوردستان و ژیانی کۆمەڵایەتی

شاعیر عاشق و سەوداسەری سروشتی کوردستان و ژیانی دێهاتی کوردەواری بووە، بۆیە کاتێك پلەی خوێندنی مەلایەتی تەواو دەکات ماڵەکەی دەگوێزێتەوە بۆ لادێ، لەوێ بە کشتوکاڵ و ماڵ و مەڕدارییەوە خەریك دەبێت، لە باغ و بێستانداریدا کارامەو لێهاتوو بووە، (گوندەکەی بە باغ و مەزراو مێشەو چنارستان و بەندو ئاش و خانوبەرەی خۆش و دلگیر رازاندبووەو بەهەشتێکی شاعیرانەی بۆ خۆی پێك هێنابوو).[6] شاعیر لە هۆنراوەی لیریکە خۆماڵییەکانی رازاوەیی سروشتی کوردستان و ژیانی دێهاتی تێکەڵاو دەکات و ئەو وێنەو دیمەنانە پێکەوە دەکێشێ، لە تاریفی حەوزو کانیاوەکانی کولتەپەو سەیرانگاکانیدا دەڵێ:

بۆ سەیری "دەروو" دەروونم خوێنە
بۆ "کانی سپی" فرمێسکم سوێرە
"کانی بەردینە" ئاوی حەیاتم
بە "کانییەی قازی" دڵم زەنوێرە
کانی لەتافەت " زنەی بەرباغی"
کانی گەوهەرە مەعدەنی زێڕە
لە یەنگی دنیا تاکو کەڵتەگە
هەڵاڵەو بەیبوون سوێسن و شللێرە
لە دوور دیارە چل ئەسحابەکەی
بنەی دوندی رەش جێ لانی شێرە
جێی وەك کولتەپەی تەپەی کەلانە
رێ پێڵگەی میوان، مەسکەنی مێرە

دیوان /٤٩

لە قەسیدەیەکی دیارو ناوداریدا، باس لە زستانی سەختی کوردستان و ژیانی ئاژەڵداری لادێنشینی کوردەواری دەکات، کە نیشانەی شارەزایی و کارمەیی شاعیر

---

(6) سەرچاوەی پێشوو: ١٥

نیشان دەدات لە ژیانی سەختی جوتیاران و زەحمەتکێشانی لادێو[7] بەم جۆرە دەدوێ:

هەوا بە حاڵم وەك كێوان دەگری
بە تەرزەو بەفرو بارانو هەوری
عەرزیش لە بۆ من هێندەی قورپێوا
بەهاری دەگەڵ زستان لێ شێوا
گیاو گوڵی مێرگان بۆم سیسو زەردبوون
بۆ شینی كێوان كەوان هەمدەرد بوون
با لە كێوو دەشت خۆڵ وەسەر دەكا
گریانی كێوان بەحران پڕ دەكا
داری مێشەو باغ بەفر دایپۆشین
پاك دەڵێی مردوون كفنیان پۆشین
كەوی كوێستانان لە قاسپە كەوتن
بێ هۆش بوون یاخۆ خەویان لێ كەوتن
چیرەو جریوەی چورەو چۆڵەكە
نایەو نەیان ما هێلانەو هێلكە
لەگلەگ لەگەل كەوت نەما تەقتەقی
سیرۆش لە سیرەو فیتوو چەقچەقی
پاك پەشیمانن لە بۆ گەرمێنێ
بۆ چ دەهاتنەوە عەمرو نەمێنێ

لەو زستانە ساردو پڕ لە وەیشوومەو بەفرو زریانەدا، حاڵی مەڕو ماڵاتو وڵساتی جوتیاری خۆڵبەسەر دەبێ چۆن بێ:

هێندە لاوازن مەڕو ماڵاتیان
قوربانی ناكرێن نادرێ زەكاتیان
گا لەبەر كزی هەڵناگری نیری
نە مەڕ ماستی ما، نە مانگا شیری
لۆك چەمبەرەی بوو، مایینش مشمشە
گا گوێ رەپەی گرت، گامێش خشخشە

(7) هەواری خاڵی : ٣٨

کـــــەڵو گامێـــــشیان بوونـــــە چەکـــــچەکی
وشـــــتریان بەعـــــەین بێـــــچووی لەگلـــــەگی
لەبـــــەر بـــــێ هێـــــزی لـــــە ترســـــی ســـــەرما
پـــــشتێندیان بەســـــتن هـــــەمووی جـل کـــــرا
بـــــزنو مـــــەڕ رووت بـــــوون وەك سوورەســـــاقە
یـــــەك‌دانـــــوو دەیکوشـــــت یـــــەك بەڵەباقـــــە
نایـــــە فیتـــــەی شـــــوان لەســـــەر شـــــەوینێ
میگـــــەلان چێـــــشتان لـــــە کـــــوێ دەنوێنـــــێ

ئەنجا یادی هۆبەو هەوارو خێڵ بەرەو ژوورو کوێستانی سالانی پێشوو دەکات، کە ئەوێستا بەفرو زستانی ساردو قڕانە مەڕی ئەو ساڵ نەیهێشتووە:

کـــــوا پـــــیرۆت ئاغـــــا ســـــەر خێڵـــــی کـــــوردان
لـــــە قولەســـــەنی ڕا بـــــچێ بـــــۆ کوێـــــستان
کوانـــــێ ســـــەید ســـــەمەد ئـــــەو مـــــەردی رەشـــــید
بـــــۆ مـــــاین بـــــلاغ بـــــڕوا بـــــە تەمهیـــــد

لـــــە کوێیـــــە تـــــاغی ئـــــەو چـــــادری جـــــوانی
تیـــــپ تیـــــپ میـــــوانی ســـــەر سـفرەو خـــــوانی
کـــــوێر بم نـــــابینم خێـــــڵ بـــــەرەو خـــــواران
تەقلـــــەو رمبـــــازیو هەوهـــــەوی ســـــواران

حاڵی کرمانجو ئاغاواتی لادێ نشین لە ساڵی قڕانە مەڕو زستانی وەیشوومەدا وەکو یەك دێتە بەرچاو:

شـــــەماڵو زریـــــان دایـــــم شـــــەڕیانە
ئاغـــــا وات شـــــڕن کرمـــــانج قڕیانـــــە
زســـــتانی ئـــــەو ســـــاڵ دیـــــارە پێـــــنج مانگـــــە
مـــــەڕو کـــــاو گیـــــا بـــــڕا لـــــە دانگـــــە
تەویلـــــەو هـــــۆڵو هـــــەیوان هەڵوەشـــــان
پـــــووشو ئـــــالاشو قـــــامیش دەرکـــــشان

درا بـــــه گـــــاڕان وەك وێنجـــــەی نوخـــــشان
خـــــرا بـــــۆ مـــــەڕی لەدانگـــــەو حەوشـــــان
کرمـــــانج دەوڵـــــەتی پـــــڕو پاتـــــاڵ بـــــوو
کۆچـــــی دێ بـــــەدێ بـــــە مـــــانگو ســـــاڵ بـــــوو

دیوان: ٥١ — ٥٣

لـە بـاس‌و وەسـفی بـەزمی شـایی‌و زەماوەنـدی لادێـی موکریانـدا شـاعیر ئـەم وێنـەو دیمەنانەمان پیشان دەدات:

جلیـــــست بـــــازان لەلایـــــەك هاتـــــە
لـــــە ترســـــی داری وان پـــــشتی فەلـــــەك کـــــووڕ
لەلایـــــەك نێـــــزە بـــــازان حەملـــــەوەر بـــــوون
لـــــە هەیبـــــەت وان دەدەن چـــــەرخ‌و فەلـــــەك ســـــوور
لەلایـــــەك نرکـــــەیی زوڕنـــــاو دەهۆڵـــــە
لەلایـــــەك ناڵـــــەی نـــــەی دێـــــت‌و ســـــەنتوور
لـــــە دەوری شـــــاییدا دوژمـــــن لـــــە حەســـــرەت
وەکـــــو گـــــۆلی مـــــەڕی دەس کـــــەن بەســـــەگ لـــــوور

وەکـــــو ڕێـــــی کەهکەشـــــان ڕێـــــزی مەجمـــــەعان
کـــــە دێـــــن دادەنـــــێن بـــــەو داب‌و دەســـــتوور

دیوان: ٦٢

٤. **کوردایەتی/** هێمنی شاعیر سەبارەت بەو لایەنە لە شیعری سەیفی قازیدا گوتویـە: (سەیفی قـازی لـە شـێعری نیشتمانی‌و شۆڕشگێڕانەشـدا یەکـەم شـاگردی قوتابخانـەی شـاعیری نـەمر فەیلەسـووفی زانـاو ڕوونـاکبیری کـورد حـاجی قـادری کـۆیی بـووە، لەمەڵبەنـدی موکریـان شـاعیرێك ناناسـین پـێش ئـەو شـێعری نیشتمانی، ئـەویش ئەوەنـدە حەماسـی دانابـێ).[8] شـاعیر لـەو قەسـیدەیەدا کـە ستایـشی خـواو نـەعتی پێغەمبـەری تیـادا کـردووە لەدوایـیەکەیـدا بایداوەتـەوە سـەر کوردایـەتی‌و حـاڵی پەرێشانی ئەو میللەتە پـیشان دەدات، لەمبارەیـەوە د. خەزنـەدار دەڵـێ: (حەسـەن بـۆ

---

(8) سەرچاوەی پێشوو: ٣٥.

یەکەمجار لە مێژووی ئەدەبی کوردی غەرەزەکانی شیعری کلاسیکی کوردی تێکەڵاو کردووە، لە موناجاتدا کوردایەتی دەکاتو لە ئیلاهیاتدا سۆزی نیشتمانی دەربڕیوە)*.
بۆیە هەر لەو قەسیدەیەی کە ستایشی خواو پێغەمبەری تێدا کردووە، هاتۆتە سەر کوردایەتیو دەڵێ:

کوردینو بێ کەسینو لەهەر لایە دەرکراو
دەستێ وە دەس مەدە، کە لە ڕێت ئێمە لانەدا
یانی نە موڵکو ماڵە لە بۆمە نەحاڵو باڵ بێ
جاهو بێ جەلال بێ حاڵو بێ سەلا
لێمە نەشاوو ئەمیرە، نەسەردارو نە وەزیر نە
حاکمو نەنایبو سەرتیپو نە سوپا
هەریەك غولامو نۆکەری بێگانە میللەتێك
زیرو کزو کەنەفتو کەسیفینو بێ نەوا
نیمانە مەرکەزێکی کە پاڵی پێوە دەین
نە مەزنو گەورەیێکی کە بۆیان بەرین پەنا

دیوان: ٢٦

دوای ئەوەی شین بۆ شێخانی شەهیدی شۆڕشی (١٩٢٥)ی کوردستانی تورکیا دەگێڕێ، دەکەوێتە سەر هاندانی ڕۆڵەکانی میللەت بۆ خەباتو بەرخۆدان:

ئەو ژینی بەو ڕەزالەتە بۆ چیتە چاوەکەم
بپسێین لەرێی نەجاتی وەتەن با بە نێرو مێو
سەرچوونی تەختی ڕۆینی سەرداری پێدەوێ
خۆشیمە لەو شەهادەتی شێخانە نێو بەنێو
کوان شێرە کوردەکان کە لە ترسیان دەلەرزی عەرز
کێ بوو لە شامێ شا بوو، لە میسرێ ببۆ خدیۆ
ئازادی، سەربەخۆیی، میری‌و گەورەیی
داوا بکەن بەزارو زبانو ددانو لێو

دیوان: ٣٦

---

* د. خەزنەدار لە دانیشتنێکدا لە سابلاغو لە ماڵی سەلاحەدینی ئاشتی لە ڕێکەوتی ٢٠٠٥/٩/٣٠دا بەم شێوەیە باسی لە سەیف کرد.

لەکاتی هاتنی لەشکری سوور بۆ ناوچەکانی موکریان و ڕووخانەوەی دەسەڵاتی شاهەنشاهی و، ئەو دەرەتانە ئازادی و ئاسوودەییەی بۆ خەڵکی موکریان هاتەدی، شاعیر نوقلانە بۆ لەشکری سوورو ستالینی پێشەوای دەوڵەتی سۆڤیەتی لێ دەدا:

کوردینە ئەورۆ ڕۆژی گەپ و شادییە
لەو نیعمەتە کە بۆ مە ستالینە حامییە
دەستی وە ئێمە داوە کە چیدی زەلیل نەبین
بانگمان دەکا کە ئێرەکە جێی ئیتمینانییە
ئەو میللەتە ڕەشیدە کە یۆڵداشی وای هەبێ
بۆ قەمع و قەلعی هەرچی ئەورووپایە کافییە
کوردینە مزدە لێو کەچی دی زەلیل نەبین
میر جەعفەریش بە ئەمری وی بۆ ئێمە هادییە

دیوان: ٦٩

لە پارچەیەکی دیکەدا بەشان و باڵی سیستمی سیاسی سۆڤیەتی ئەو کاتەدا هەڵ دەڵێ:

بۆ مەدحیان بەسە کە کەسی بێ کەسان ئەون
بۆ میللەتی زەعیف هومێدو هاناوییە
کاری بە دەستی خۆیەتی هەر میللەتێکی بێ سەردا
دەنێن لە بۆیە لە ڕێی کەس نەماوییە
قەفقازو ڕووس و ئۆزبەک و تفلیس و ئیرەوان
تاجێک و تات و ترکەمەن و هەرچی ناوییە

هەر کەس بە مڵک و میللەتی خۆی شادو ڕازاییە
ئازادی، سەربەخۆیی وەها پێ دراوییە

دیوان: ٧٣

شاعیر لەجێگەیەکدا باس لە ژیانی ڕەزاڵەت و دەردی سەری خەڵکی موکریان دەکات لەژێر سێبەرو سایەی ڕەزا شادا کە جل و بەرگ و داب و دەستووری کوردەواری قەدەغەو یاساغ کرابوون:

کاری کوردان هەر خۆزگە بە پارە
هەر کەس بە دەردێک چوو گرفتارە
جەمعێك بە بیانووی تەجدیدی نەزەر
سەرگەردان کران لە قاپیەو لەدەر

لـــــــەتاو مـــــــەشموولی کـــــوردی موکریـــــــان
کـــــچیان ئـــــارەزوو لـــــەجیاتی کوڕیـــــان
لـــــــە خـــــــەڵکی دەدەن کوانـــــێ کـــــلاٚوت
بۆچـــــــت لەســـــــەرنا شـــــــەدەی بـــــلاٚوت
یـــــــەکی دی دەگـــــــرن ســــــجیلت کوانـــــێ
مـــــاڵی قاچـــــاغت لەســـــــەر دوکانـــــێ
تـــــوتنی نووســـــراوت بـــــۆ کـــــێ بـــــردووە
ئیمـــــزای مالیـــــەت کـــــوا وەرگرتـــــووە
هێنـــــدە پـــــووڵ درا بـــــۆ دەفعـــــی شـــــەڕیان
بـــــەتاڵ بـــــوون جێـــــبو گیرفـــــانی پڕیـــــان
لـــــەتام چـــــۆتە دەر مـــــەزلومی کـــــوردان
خودایـــــە ڕوحمێـــــك بـــــە چـــــوك وردیـــــان

دیوان: ٨٠

**٥. نامەی شیعری:**

لە بەرهەمی شیعری سەیفی قازیدا کۆمەڵێك نامەی شیعری هەن، کە بۆ دۆستو ئاشناکانی ناردووە. لەم نامانەدا خۆشەویستیو سۆزێکی ڕاستەقینە بەدی دەکرێت، شاعیر چەند نامەیەکی بۆ عەزیز ئاغای هاوڕێی هۆنیوەتەو کە جگە لە دەربڕینی هەستی دۆستیو خۆشەویستی، کۆمەڵێك باسو بابەتی جیاجیاشی لە نامەکاندا دەربڕیوون. لێرەدا دەورێکی شیعرنامەکانی شاعیر دەکەینەوە:

لە یادی عەزیز ئاغای هاوەڵی دەڵێ:

کوێـــــستانی دووریـــــت هـــــەر زەردو ماهـــــە
تـــــەرتو لابـــــەلا ڕژدو هەڵـــــدێرە
بـــــاری فیراقـــــت پـــــشتی شـــــکاندم
بەســـــەرما دادێ دەڵێـــــی تـــــاوێرە
ســـــەرباری دووریـــــت شـــــانمی جـــــدەوکرد
بـــــەتاو توورەکـــــە بـــــەهۆرو تێـــــرە
وەك مـــــەجنوون لـــــە دوت کەوتمـــــە کێـــــوان
ڕەفـــــیقم گـــــورگو پلـــــنگو شـــــێرە

بــــۆ هـــــەر جـــــێ دەچـــــی دڵ بەدوتـــــەوە
کۆنــــــە راوکــــــەرە دیـــــارە شــــوێن گێـــــڕە
عیـــــشقت لەســــــەرم قـــــەت ناچـــــێتە دەر
لەســــــەر سەریـــــــشم بگێـــــــڕن گێـــــرە

دیوان: ٤٩

هەروەکو لە شیعرەکانی سەیف دا بەدیار دەکەوێت (هاوڕێیەتیو برایەتی لەگەڵ عەزیز ئاغای عەباسی گەیشتۆتە رادەی دڵداری سۆفیزمی)،[9] بۆیە زۆر بە سۆزو جۆشو پەرۆشەوە لەچاوەڕوانی دیداریدا دەڵێت:

عــــــەزیز ئـــــارەزووت زۆری بـــــۆ هێنـــــام
فرمێـــــــسکم ســـــــووربوو زەردی رووی لێنـــــام
دیـــــسان بـــــە ئـــاوری دووریـــــت کەوتمـــــە گـــیر
دنیـــــام لـــــێ ســــاردبوو بـــــوو بـــــە زمهـــەریر

دنیـــــا وا پـــــڕ بــــوو لـــــە بـــــەفرو ســــیخوار
فرمێـــــسکی ســــوورم بـــــە ســـــپی هاتنـــــە خـــوار
تـــــا ناهومێـــــد بــــووم لـــــە هـــــاتنی زوت
جـــــەرگم بـــــۆ پۆلـــــو هەناســــــەم بـــــزوت

دیوان: ٥١

لەبواری نامەی شیعریدا دەگوترێت کە (شاعیرانی کورد لە کۆنەوە زۆر شیعرنامەیان بەکار بردووە...زۆربەی نامەکاری شاعیرانیش لەمەڕ پێوەندی دوو کەسو بۆ دۆستیو لەیەك حاڵی بوونە، بەڵام هەمیشە – وێڕای ئەو باسانە چمکی بەسەرهاتو مێژووی قۆناغێکی ژینی نەتەوەی گرتوە).[10] بۆیە شاعیر لەنامەکانیدا بۆ عەزیز ئاغای هاوڕێی وێڕای دەربڕینی سۆزی خۆشەویستی دۆستانەی نێوانیان دەپەڕژێتە سەر باسو بابەتی ژیانی دێهاتو باغو مەزراو کشتوکاڵو ئاژەڵداریو تا بەوە رادەکات تاریفی جوانانو نازدارانی کوردەواریش دەهێنێتە گۆڕێ. لەولاوەش کۆمەڵێك پەندو ئامۆژگاری دادەدا بۆ جوتیارانی لادێ تا بە مشوورو کارسازو دەست رەنگین بن، جگە

(9) مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٥: ٣٥٦
(10) ئەدەبی نامەنووسیی کوردی، ب١: ٦١

لەوەش شاعیر لەو نامانەیدا بۆ عەزیز ئاغا باس‌و خواستی ئازادی‌و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی وڵاتان بۆ هاوڕێکەی دەگێڕێتەوە، هەر لەو نامەیەی کە لەپێشەوە چەند دێڕێکمان بە نموونە لێ هێنایەوە، شاعیر باس لە ئازادی‌و یەکسانی ژنان دەکات لە وڵاتی فەرەنگی‌و دەڵێ:

بۆ فوتبال دەچن، سیرک‌و تیاتر
کچ لە پێشەوە کوڕان لەدواتر
کچ‌و کوڕ تێکەڵ هەروەك شەکرو شیر
پیاوو ژن ژینیان وەك یەك جوان‌و پیر
وەرزش زۆرانی دەکەڵ یەك دەگرن
عەیب‌و عار نیە نابێ تێك فکرن
باسك راست دەکەن خۆ دادەنوێنن
سینگ رەپێش دەکەن لاقان هەڵدێنن
ئەوجار هەر کەوتن بۆ کوڕ لایقە
لەسەر یا لەژێر هەر ئەو فایقە
ژن‌و پیاو وەك یەك زەحمەت بکێشن
فەرەنگی بەوەی لێمە لە پێشن
دیوان: ٥٨

شاعیر لە وەڵامی دێرە شیعرێکی سڵاونامەی حاجی کاکە رەحمانی فەیزوڵڵابەگیدا گوتویەتی:

خەیاڵی هیجری ئێلخانی کە دەکرێ
دڵی گەورەو بچووکی مە گڕ ئەگرێ
ویسالت چۆن نییە بۆ من مویەسەر
سڵاوت بۆ دەنێرم لێرە تا دێ

دیوان: ٥٦

لەنامەیەکی شیعریدا کە بۆ عەلی بەگ سالار سەعیدی حەیدەری هۆنیوەتەوە، بەم جۆرە نامەکەی بەکۆتا دێنێ:

خوا بکا دائیمەن وا شادمان بی
عەزیزی ئارەزووت خۆی بێ لەرێی دوور
هەمیشە دێیەکەت وا ئاوەدان بێ

ولآتـــــى دوژمنـــــت وێـــــران‌و خـــــاپوور
لــــه داشـــــالوجه ڕا حـــــوجرەی فـــــەقێیان
لــــە دووری مەوتـــــەنی تـــــۆم زارو ڕەنجـــوور

دیوان: ٦٢

شاعیر وەڵامی نامەیەکی عەزیز ئاغای ناوبراوی هاوڕێی بەم شێوەیە داوەتەوە:

نامـــــەی گرامیـــــت حـــــەزرەتی نـــــامی
پـــێم گەیـــشت لــــە دەســـت شەخـــسێکی نـــامی
نامـــــەی گرامیـــــت وەختـــــێ پـــێم گەیـــــشت
هێنـــــدە کـــەیف خـــۆش بـــووم دنیـــا تـــێم گەیـــشت

تاوەکو دەڵێ:

ســـــایەی عـــــەزیزی هـــــەر کـــــەس لەســـــەر بـــــێ
لـــــەنێو گـــــشت ســـــەران دەبـــــێ ســـــەروەر بـــــێ
خزمـــــەتت دەکـــــەین ئێمـــــەش تـــــاکو هـــــەین
تـــۆش دەرســـــان بڵـــێ بـــەبێ کـــەین‌و بـــەین

دیوان: ٦٨

## باسی سێیەم

### ناوەڕۆکی شیعری مستەفا شەوقی

وەکو ڕاستییەك لە پێشەوە ئاماژە بۆ ئەوەکرا کە بەرهەمی شیعری شەوقی لەباری ناوەڕۆکەوە خەسڵەتەکانی شیعری ڕۆمانتیکی پێیەوە دیارو ئاشکران، لەمەوەش بەزەحمەت دەتواندرێت هێڵی جیاکەرەوە لەنێوان مەبەستەکانی شیعری شاعیر، بە پێڕەوی شیعری کلاسیکی کوردی، بکێشرێت. نەخاسمە کاتێك کە دەبینین شاعیر سۆزو خۆشەویستی نیشتمانو نەتەوەکەی کردۆتە هەوێنو تێکەڵ بە هەموو مەبەستەکانی شیعری کردووە. لەم بارەوە د.خەزنەدار نووسیوویەتیو دەڵێ: (شیعری مستەفا شەوقی لە ڕووی ڕووخسارەوە بەر تەسكو دیاری کراوە، هەروەها لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە تەنیا لە دڵداری دەدوێنو بە گیانی نیشتمان پەروەریو کوردایەتی موتوربەکراون، واتە ناوەڕۆکیان مەبەستی دڵداریو سیاسییە، بەڵام هەردوو مەبەستی تێك ترنجاندووە بەجۆرێك یەکێتییێکی پتەوی لەنێواندا دروست کرووە، لە یەکتری جیانابنەوە، بیننو خاسیەتەکانی شیعری ڕۆمانتیکی ئەوروپا لە شیعری مستەفا شەوقیدا ڕوونو ئاشکران، بەشێوەیەك چێژو خەیاڵی ئەوروپایی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە ڕەسەنایەتی ئەو شیعرەی پاراستووە).(11) لێرەوە گەشتێك بەناو گوڵزاری شیعری مستەفا شەوقیدا دەکەینو تیشکی ڕووناکی دەخەینە سەر هەندێ لایەنو مەبەستەکانی شیعری:

١. شیعری دڵداریو خۆشەویستی:

شاعیر هەستی ئەڤینو خۆشەویستی یارەکەی لە چەند پارچەیەکی لیریکی لە شێوەی غەزەلدا هۆنیوەتەوە وەکو لە هۆنراوەی (لە بۆ هاواڵی ماتەمدار)دا دەڵێ:

بۆچ دەناڵێنی، لەسەر لێوت لە بۆچ بارکەوتووە
لەشکری زولفت کە خاوو کاڵە بۆچ ڕووی گرتووە
ئاهی تۆ وەك بای سمووم هاتو قەڵبی دادڕیم
ئەی فەلەك گریەت کە ئەو جارە بۆ وات کردووە
چەندە مەحبووبە لەسەر ئەندامی سەروت جلکی ڕەش

---

(11) مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٥: ١٥٥.

تۆ بە فرمێسکی خوێن ئەو ڕەنگە ڕووت بۆ شوشتووە
ڕەنگی تۆ خۆ زەردە زولفت کاڵە قامەت مامەشی
یا لەنێو پایتەختی ڕۆمی سوێسنەو پشکوتووە

لە هۆنراوەی (وەرەقێك لە دەفتەری خاترات)دا شاعیر دیسان بە زمانی دڵ، دڵدارەکەی دەدوێنێ:

فیدای چاوت عەزیزم ئەوڕۆکە حاڵم پەرێشانە
لە دووری تۆ دوو دیدەم غەرقی خوێنە بەحری عوممانە
عەجەب کۆرپەی دڵم نادا هەدا شەوگاری تەنهایی
نەباتی قەندی لێوی تۆی دەوێ بێچارە بێ زمانە
بەناز ساتێ وەرە دەستێ بنێ سەر قەڵبی مەجرووحم
خەناوی بێ بە سووری پەنچەکانت ڕەنگی مەرجانە

ئەنجا لە کۆتاییدا هەموو ئەدگارەکانی جوانی بە یارەکەی دەبەخشێت و دەڵێ:

مەلاحەت خەتمە سەر تۆ گەرچی وەك نێوت لە چاو دووری
لە بۆ شەوقی دوو کوڵمی پڕ فسوونت تازە دیوانە

لە پارچە غەزەلی (مەگەر لێم عاجزی) دەردی دڵ لەگەڵ خۆشەویستەکەی دەکاو لە شێوەی دیالۆگدا لێی دەپرسێ:

لەمن بۆ چ زیزی عەمرم؟ چاوەکانم ماهی تابانم
تەوێڵت بۆچی گرژە یا چ قەوماوە چیە تاوانم
لە پێشا پێشی تابووری موژەت هەردوو برۆت کەچ بوو
دەڵێ بۆ تیپی عاشق زوڵفەقارە تیغی بۆڕڕانم
کەمەندی زولفی خاوت چونکە بازووبەندی بازوومە
چ حاجەت واعیزی سەر زڵ بە ئەفسوون بەستی دەستانم

ئەنجا لە کۆتایی پارچەکەدا شاعیر بەم شێوەیە وەڵامەکانی دەسگیر دەبێتەوە:

بەڵێ شەوقی کە کوردە چاو بەخوێنە قەت هەدانادا
بە خوێنی چاوەکانم سوور بووە چاکی گریبانم

لە پارچە لیریکەکانی شەوقیدا، بەشێوەیەکی قووڵ تەعبیر لەو هەستو سۆزانە کراونەتەوە کە دیاردەی جوانیو خۆشەویستی لە دەروونی شاعیردا وروژاندویەتی، لێرەدا (گرنگ خودی هەستو سۆزەکان نییە بەهەردوو دیوی سلبیو ئیجابی، بەڵکو ئەو کاردانەوە پڕ لە کاریگەرییەی ناخی شاعیرە کە لە دەرەوەیدا وەردەگیرێ).[12]

٢. کوردایەتی

شەوقی بە یەکێك لە پێشەنگەکانی شیعری سیاسیو نیشتمانیی ناوچەی موکریان دەناسرێتو لەم بارەوە لە لێکۆڵینەوەکەی هێرشدا لە گۆڤاری (گزینگ) سەبارەت بەو مەسەلەیە هاتووە، (ئەوەی راستی بێ لە کوردستانی موکریاندا سەرەتای شێعری نیشتمانیو سیاسی لەپێناو ئامانجو بوژاندنەوەی هەستی نەتەوەیی، هاوکات لەگەڵ داگیرسانی شەڕی جیهانیی یەکەمدا بەهۆی دوکتۆر مستەفا شەوقی دەستی پێکردووە).[13] شاعیر لە هۆنراوەیەکی دا بە نێوی (فەریاد) کە بە (مناسەبەتی قەتلو عامی رووسان لە سابلاغ) نووسراوە، دیارە مەبەستی رووداوەکانی ساڵی ١٩١٥یە،[14]شاعیر لەدوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ئەو رووداوەداو لە شاری موسل هۆنراوەکەی هۆنیوەتەوە کە تیایدا دەڵێت:

وەرە تا شەرحی ئەحواڵی دڵی خۆمت لە بۆ بێژم
وەرە تا من بە فرمێسکم بشۆم بۆت پەردەیی تاری
عەلیم الله لە پاش تەشریفو چوونی تۆ لە سابلاغێ
وەتەن وێرانو ماڵ سووتاو و کیژێ بێ لاوو خوێن باری
دەنێو مێرگوڵەکاندا سوێسنی زەردو هەڵاڵەی سوور
لە باغو باخچەکاندا بولبولی شەیداوو پاساری
بەزوڵمو جەوری دوژمن بوو بەهاریان زەردە پاییزێك
لەبێ روحمیو دڵ سەختی بەباریان بار لە لێو باری
لە ئاغایانو ئەشرافو مەلایان کەس نەما ئەورۆ
لەسەر ئەنقازی ماڵیان خۆ دەخوێنێ کوند بەبێ عاری

گ/ ژین، ژ/٢: ١٢، ١٣

---

(12)موسوعة نظرية الادب — الشعر الغنائي: ٦.

(13) رەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانیو سیاسی لە موکریان: ٦٤.

(14) تاريخ مهاباد: ٧٨.

لە هۆنراوەی (هاواری دایکێ) شاعیر بەشێوەیەکی دراماتیکی وێنەی نەوجەوانێکی کوردی خەوالّو نیشان دەداو دەیەوێ دەمارەگانی هەستی نیشتمانپەروەری بێنێتە جۆش‌و خرۆش‌و لەپێناوی ئازادی‌و سەربەخۆییدا بکەوێتە کارو تەقەلادان.

بەهار هاتو نەشئەی بای وەعدەیە عومرم تەماشاکە
لەبەر مالّی وەسیعی مولکی بابت دەنگی سەمتووری
سەدای هاتو نەهات دەنگی زەنگوڵ قۆری کاروانە
کە یارت کۆچی کردو دەستە داوێن هێشتە مەهجووری
چلۆن سەبرێ دەکەی گەر یاری تۆ بدزن لە مالّی تۆ
لەنێو بێگانەکان تەشهیر بکەن نێو بەندو بەر مووری
وەکو باپیرە گەورەت حیفزی ناموست لەسەر شەرتە
کە دایکت پیرو خوشکت مردو مالّت چوو لە خاپووری

دیارە هۆکاری ئەم دیلی‌و پەرێشانییەی حال‌و باری کوردان لەلای شاعیر هەر (دەردە کوردە)ە کوشندەکەی (جەهل‌و غەفلەت)ە کە لە ئەدەبیاتی کوردیدا باوە، بۆیە لەو روانگەیەوە شاعیر داوای دامالّینی ئەو زنجیرە دەکات کە باسك‌و بازووی نەوجەوانانی کوردی پێ بەستراوە:

بەلێ زنجیری دەستت جەهل‌و غەفلەت بوو رەقیبی تۆ
بە ئەفسوون بەستی قۆلّت چونکە زانی مەست‌و مەسحووری
ئەوێستا تا لە بێخەی رۆهەلاتی تاو هەلات رابە
بە ئازایی نەجات دە دەستی بەستراوت کە مەغدووری
سەلاحی کاری تۆ سەعیەو عەمەل بابی نیگەهبانت
بە رووناکی چرای عەزمت بڕۆ بۆ شاری شاپووری
دەژینێ حەقی خۆت سابیت بکە بۆ یارو ئەغیاران
بە دەستڕە بسڕە فرمێسکی شەوقی‌و چاوی بێ تووری

گ/ ژین، ژ/ ١: ١٤، ١٥

لە تێکستی هۆنراوەی (حەسبوحالّ دەگەلّ وەتەن)دا، کە لە دیمەنێکی مەزاری شەهیدی کوردەوە سەرچاوە هەلّدەگرێ، شاعیر دەلّێ:

خەملیوە لەسەر قەبری جەوانان گوڵو لالە
یا سووریی خوێنە کە بڵێی رەنگەکی ئاڵە
پێش تابشی خورشیدی فەلەك وەقتی بەهاران
وەك چاو لە فرمێسکی منە قەترەیی ژاڵە
ئەی بادی سەبا هەستە گوزەرکە بە وەتەندا
پەخشان بکە سەر ئەرزی وەتەن بۆنی گوڵاڵە
بابێتو بە تەئسیری فسوونی نەفەسی تۆ
وەك غونچە بپشکوێ دەمی ئەو کوردە کە لاڵە
بابێتو سبەینان ئەلەمو دەردی شەوی هەجر
بێژێ، کە لەوەی پاش خەوی مە، مەحزی وەباڵە
قەهری فەلەكو جەوری رەقیبو ستەمی دۆست
سەرناسیەیی پڕ شکەنی کرد بە قەباڵە
چارت نییە ئەورۆکە ئەتۆ دەستە شکاوی
بەد مەستیی مەی بوو کە شکا جامو پیاڵە
شەوقی وەرە لەو غوربەتە مائیل بە وەتەن بە
بێ خاکی وەتەن عیززەتی تۆ مەحزی خەیاڵە
بەم کاکۆڵی رەش رەنگە کە بۆزی فیراقە
بارام بێ لە بۆت فەزڵو هونەر چونکە حەلاڵە

گ/کوردستان، ژ/ ٥: ٥٦

ئەم تێکستە لەباری مەبەستی نیشتمانیو سیاسییەوە (یەکێکە لە پڕ ناوەرۆکترین هۆنراوەکانی شاعیرو شەوقی دەمی کوردی لاڵی بە خونچەیەکی نەکراوە چوواندوە کە تەنیا بای سەبا "کە پەیامی شاعیر خۆیەتی" دەتوانێ بیپشکوێنێو وەك گوڵاڵە کە بیرخەرەوەی خوێنی هەزاران لاوی کوردە، زمانی حاڵیان بێتە ئاخاوتنو وەخۆکەوتن، داوای ئازادیو سەربەخۆیی بکەن).(15)

شەوقی لە شەوقی زیندووبوونەوەی کۆمەڵەی (هێڤی)دا، دوا بەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ، هۆنراوەیەکی بەنێوی (جەوانان) هۆنیوەتەوە کە لە سەرەتایەوە دەڵێ:

---

(15)رەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانیو سیاسی: ٦٥

هەڵــــستاون جـــەوانانی وەتـــەن دیـــسان بـــەبێ بـــاکی
لــــە حەســـرەت دەردی کۆنـــە مـــوڵکی بابیـــان هاتنـــە چـالاکی
دەدڵ عـــەزمو لەســـــەر شـــۆڕی جـــوانی هـــاتوو دەخـــوازن
کـــە بـــڕژێنن لەســـەر خـــاکی وەتـــەن خوێنییـــان بەســـەر پـــاکی
بـــلاّ تێـــر ئـــاو ببـــێ بـــەو خوێنـــە ســـووره گـــوڵ لـــە مێرگـــوڵان
بـــە شـــوعلەی نـــووری ئومێـــدیان وەتـــەن بابێتـــە ڕوونـــاکی

ئەنجا لە کۆتاییدا ڕۆڵی (هێ وی) لە یەکخستنی ڕیزی ئازادیخوازانی کورد دەخاتەڕوو، کە چۆن ناوو ناوەڕۆك بوونەتە یەكو مایەی ئومێدی لاوەکانی گەلی کورد، کە شاعیر خۆیشی یەکێکە لە ڕیزی ئەوان:

لــــەنێو جوانـــــان لــــە پێـــشدا شـــەوقی بێـــچارە وێـــستاوە
بـــە نـــووری حـــوببی مەوتـــەن دڵفـــرووزەو هاتـــە ڕوونـــاکی
لـەڕێگای دەوری (هـی وی) یـەعنی ئومێـد دەسـت بـە دەسـت دەگـرن
بە عیلمو مەعریفەت تێر ئاو بکەن جا خاکەکەی پاکی

گ/کوردستان، ژ/ ٩

بەرلەوەی باسی ئەم لایەنە لە شیعری شەوقی بەکۆتا بێنین ئەو سەرنجەی هێـرش دێنینەوە کە دەڵێ (شەوقی یەکێکە لە ئالا هەلگرانی قۆنـاغی ڕۆشـنگەری، کـە زوڵـمو زۆری داگیرکــەرانو دوژمنــانی کــورد لــەلایێكو چــەند دەســتەییو پاشــکەوتوویی و نەخوێنـــدەواری کۆمەڵگـــەی لـــە لایێکـــی دیکـــەوە کاریـــان تێکـــردووەو هەســـتیان هاروژاندووە، بۆیـە بنـەمای بـیرو بۆچوونی نەتـەوەخوازی لـە تـەواوی شێعرەکانیدا هەست پێدەکرێ، ئەو لەباری شێعرەوە نەك تەنیا ئارمانج خوازە بەڵکو بە کردەوەش پیاوی کارو تێکۆشان بووە).(16)

---

(16) سەرچاوەی پێشوو: ٦٦.

# ئەنجام

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتووینەتە کۆمەڵێك ئـەنجام و دەتـوانین لەچـەند خاڵێکـدا دەستنیـشان و چـڕیان بکەینـەوەو بیـان خەینـە روو، کـە مـۆرك و تایبەتمەنـدی بەرهـەمی شیعری ئـەم قۆناغـەی نیـوەی یەکـەمی سـەدەی بیـستەم لـە تاقیکردنەوەی ئەدەبی ناوچەی موکریان پێك دەهێنێ ئەویش بەم جۆرەیە:

١. نەوەی یەکەمی گەورە شاعیرانی ناوچەی موکریـان لـە وێنـەی (وەفـایی، حـەریق، ئەدەب) لەسەر بنەماو بناغـەی قوتابخانـەی شیعری کرمانجی خـواروو، ئـەزموونێکی شیعری بەبرشت و دەوڵەمەنـدیان لـەو ناوچـەیەدا داهێنـاوە و بـەرپا کـردووە، ئـەنجا پایـەکانی ئـەم ئەزموونـەیان بـە جـۆرێ دارشـتووە کـە دوای ئـەوانیش بـەردەوامی هەبووەو چەند نەوەی دیکەی لەشاعیران پێگەیاندووە.

٢. نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە ناوچەی موکریان رێنیسانسێکی روونـاکبیری و ئەدەبی لەئاراداهەبووە کە سێ شاعیری ناوداری ناوچەکە وەکو (مـەلا مـارفی کۆکـەیی – سـەیفی قـازی – مـستەفا شـەوقی)رێبەرایـەتییان کـردووە، ئەمانـە هەرسـێ کۆڵەگەکەی ئەم جولانەوە شیعرییە پێك دەهێنن لەو ماوەیەدا.

٣. سـەبارەت بـە هونـەرەکانی روخـسارو نـاوەرۆك لەبەرهـەمی شـیعری شـاعیرانی نـاوبراو کۆمـەڵێك گـۆڕان و داهێنـانی تـازە بـەدی دەکـرێ کـە بوونەتـە هـەوێنی رەنگرشتنی بزووتنەوەیەکی نوێ لە رەوتی بەردەوامی شیعری کلاسیکی کوردی لـەو ناوچەیەدا.

٤. ئەم بزووتنەوە تازەیەی شیعری ناوچەی موکریان لەو ماوەیە لەباری هونەرەکانی روخسارەوە لەزمان و شێواز و وینە و بنیات و ئـاوازی شـیعرییەوە بـەدیار دەکـەوێت، وەکو چۆن لـەباری ناوەرۆکیشەوەلەپاڵ مەبەستە تەقلیدییـەکانی شیعری کلاسیکی، مەبەستی شیعریی تازەش هاتۆتە نـاوەوە، لەوانـە تێکەڵاوکردنی گیـانی کوردایـەتی و خۆشەویستی نیشتیمان و میللەت پەروەری لەتەك شیعری ستایشی ئـاینی و شـیعری عاشـقانە و وەسـفی سروشـتدا، وەك بەتایبـەت لـەناوەرۆکی شـیعری سـەیفی قـازی و شـەوقیدا دەدرەوشـێتەوە.هـەروەها بابـەتی شـیعری تۆمـارکردنی مێـژووی کارەسـات وپەرێشانی و داخی دەروون و شیعری سەرزەنشت و بابەتی رەخنەی کۆمەڵایـەتی کـە لەبەرهەمی مەلا مارفدا رەنگی داوەتەوە.

٥. شیعری ئەو دەورەیە لە چوارچێوەو سنوورو دەستوورەکانی شیعری کلاسیکی کوردی تێپەڕیوە و مۆرکی لیریکی شیعری تازەبابەتی بەخۆیەوە گرتووە لەڕووی روخسارو تەکنیکی شیعرییەوە، هەروەها لەباری ناوەڕۆکیشەوە پەلی بۆ لیریکی سیاسی و نیشتیمانی و رەخنەی کۆمەڵایەتی هاویشتووە.

٦. خاسیەتەکانی ئەدەبی رۆمانتیکی، ریالیزمی فۆتۆگرافی و رەخنەگرانە لەبەرهەمی شیعری ئەم دەورەیە و بەتایبەت لای شاعیرانی ماوەی باسەکەی ئێمە لەناوچەی موکریان، بەڕوونی بەدی دەکرێن لەڕووی زمان و شێواز و وێنە و وەسفەوە، هەموو ئەمانەش بە ئەدگارێکی کوردانە و خۆماڵی تەعبیریان لێ کراوەتەوە.

٧. تایبەتمەندییەکی دیکەی بەرهەمی ئەدەبی ئەو دەورەیە بریتییە، لە خۆ نزیک خستنەوە لە زمان و دەربڕینی ئاسانی خۆماڵی، زەوق و سەلیقەی کوردانە، لەپاڵ پاراستنی مۆرکی رەوانبێژی و بیناسازی هەڵبەستی کلاسیکی، بەنموونە لەبەرهەمی سەیفی قازیدا کۆمەڵێك بەرهەمی هۆنراوەی کێشی برگەییمان بەرچاو دەکەوێت، لەپاڵ پاراستنی یەکێتی سەرواو کێشی عەرووزی لەبەرهەمەکانی دیکەی دا. لەلای مستەفا شەوقی گیانی زیندووی کوردەواری و کوردایەتی لەچوارچێوەی تەکنیك و بیناسازی کۆندا دەربڕاوە و بەڕوونی و ئاشکرایی هەستی پێ دەکرێت.

٨. ئەم ئەزموونە ئەدەبییەی ناوچەی موکریان کە شاعیرانی ماوەی باسەکەمان برەویان پێداوەو بەردەوامییان پێ بەخشیوە، بۆتە بناوان و سەرچاوەو رێگە خۆشکەرێك بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی تازە لەشاعیرانی ناوچەی موکریان لەناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا لە وێنەی (هەژار و هێمن و هێدی و خاڵەمین و سەید کامیل و حەقیقی و نوری ....) کە تاقیکردنەوەکەیان بە پۆپە گەیاندووەو سامانێکی گەورەیان خستۆتە سەر مێژوو گەنجینەی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی.

# ABSTRACT

## The Poetic Works of Mukriyan in the First Half of the Twentieth Century (1920 – 1940)

This thesis is concerned with a description and analysis of poetic output of three contemporaneous poets of Mukriyan area, namely, Mala Marif of Kokayi (1874 – 1954). Saif of Qazi (1876 – 1944) and Mustafa Shawqi (1896 – 1950). The study is restricted to the period between the two World Wars, which constitutes the acme of the three poet's perfection, on the one hand and one of the most important eras in the history of Kurdish literature, and poetry in particular, on the other.

The nature of the study necessitated that it be divided into five chapters, preceded by an introduction, and closed off by the conclusions that the study reached, apart from a list of references, documents and photographs that support the study.

The first chapter is a preamble to the basics of the study. It presents a brief account of the historical, social and cultural conditions of the whole area, with emphasis on the emergence and the originality of the classical school of poetry, pioneered by the classical poets like, Wafayi (1844 – 1920), Hariq (1856 – 1909) and Adab (1859 – 1916), stressing that the original prolific literacy store created by the minds of those pioneers formed an appropriate rich background that triggered off a remarkable everlasting literary experiment later in this area.

The second chapter presents a brief account of the literary and life style of the peots under the study with a short reference of the published sources which deal with these aspects.

The third chapter is devoted to the study of formal characteristics of their poetic product, pointing out their style and poetic language, the rhetorical and descriptive images of each.

The fourth chapter explores other the formal features like structural patterns, the rhythmic and the metric patterns and rhyming schemes. To each of these artistic devices a separate section in the third and fourth chapter is devoted, where citations from their poetry occurs, where necessary.

The last chapter explores the varied literary content and themes of the poetic output of the three poets, elaborating on the traditional or classical poetic themes and pointing out, meanwhile the modern themes that coincided with, and accompanied, the modern literary trends and approaches, including the Romantic trend in the Kurdish Literature of the first and second decades of the twentieth century.

Finally, come the most important conclusions that the investigation arrives at, with a list of Kurdish, Arabic and Persian consulted sources, and a special file of relevant documents and photographs in the appendix.

# سەرچاوەكان

١. كتێـــب

أ. بە زمـــانی كـــوردی:


١. ئەدەب و رەخنە، عەزیز گەردی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٧٤.

٢. ئەدەبیاتی نوێی كوردی، د. عیزەدین مستەفا رەسول، مگبعە التعلم العالی، اربیل، ١٩٨٩.

٣. ئەدەبی نامەنووسی كوردی، كەمال رەئوف محمەد، جزمی ١-٣، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

٤. بارودۆخی سیاسی كوردستان، موجتەبا برزوویی، وەرگێرانی لە فارسییەوە: نازناز محەممەد عەبدولقادرو ئەوانی تر، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكریانی، هەولێر، ٢٠٠٥.

٥. بەشێك لە بەرهەمەكانی دكتۆر مستەفا شەوقی قازی زادە، گردوكۆی: ئەحمەد شەریفی، چاپ لەیزێر، مهاباد، ١٣٨٤.

٦. بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری كوردی دا، سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٧. بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی كوردی دا، د. دلشاد عەلی، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ١٩٩٨.

٨. بووژانەوەی رۆشنبیری و نەتەوەیی كورد، جەلیلی جەلیل، لە عەرەبییەوە وەرگێرانی: سدیق ساڵح، چاپخانەی هەواڵ، سلێمانی، ٢٠٠٠.

٩. بیرەوەرییەكانی وەفایی، گردوكۆی: قازی محەممەد خزر، وەرگێرانی لە فارسییەوە: محەممەد حەمەباقی، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٩.

١٠. پاشەرۆك، هێمن، چاپەمەنی سەیدیان، مهاباد، ١٣٦٢.

١١. تاریك و روون، هێمن، لە بڵاوكراوەكانی بنكەی پێشەوا، بەغدا، ١٩٧٤.

١٢. تحفەء مظفریة، پێشەكی و ساخكردنەوەی: هێمن موكریانی، چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٥.

١٣. تۆفیق فیكرەت و شاعیرە نوێخوازەكانی كورد، ئەحمەد تاقانە، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١.

١٤. جووتە وشەی لێكدراو لە زمانی كوردیدا، د. كەوسەر گەلاڵی، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

١٥. چێشتی مجێور، هەژار، چاپی یەكەم، پاریس، ١٩٩٧.

١٦. حاجی قادری كۆیی، مەسعود محەممەد، ب١، لە چاپكراوەكانی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٢.

١٧. خەبات لە رێی كوردستانا، ن.أ. خالفین، وەرگێرانی لە روسییەوە: جەلال تەقی- چاپخانەی راپەڕین، سلێمانی، ١٩٧١.

١٨. دیداری شیعری كلاسیكی كوردی، حمە سعید حمە كریم، چاپخانەی (دار الحریە)، بەغدا، ١٩٨٦.

١٩. دیوان و شەرحی حاڵی شێخ ئەحمەدی كۆر، عەزیز موحەممەد پور، چاپخانەی پەیام، تاران، ١٣٧٨.

٢٠. ديوانی ئەدەب، كۆكردنەوەو ساغكردنەوەی: محەممەد حەمە باقی، دەزگای چاپو بلاْوكردنـەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥.
٢١. ديوانی سيف القضات، گردەوە كۆيی، قازی ئەحمەد، چاپخانە سبز، ١٣٦١.
٢٢. ديوانی ملا معروف كۆكەيی، سيديان، مهاباد، ١٣٤٦.
٢٣. ديـوانی نـالیو فەرهـەنگی نـالی، لێكۆڵينـەوەو سـاغ كردنـەوە: د. مـارف خەزنـەدار، دار الحريـە للطباعة، بەغداد، ١٩٧٧.
٢٤. ديوانی وەفايی، لێكۆڵينەوەی: محەممەد عەلی قەرەداغی، لـە چـاپكراوەكانی كـۆڕی زانيـاری كـورد، بەغدا، ١٩٧٨.
٢٥. ڕابەری ڕۆژنامەگەری ی كوردی، جمال خزنەدار، چاپخانەی (الجمهوريە)، بەغدا، ١٩٧٣.
٢٦. ڕابەری كێشی شيعری كلاسيكی كوردی، عەزيز گەردی، چاپخانەی دێكان، سلێمانی، ٢٠٠٣.
٢٧. ڕەخنەی ئەدەبی كـوردیو مەسـەلەكانی نوێكردنـەوەی شيعر، د. پـەرێز سابير، دەزگـای چـاپو بلاْوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥.
٢٨. ڕەوانبێژی لە ئەدەبی كورديدا، عەزيز گەردی، ب١، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا، ١٩٧٢.
٢٩. ڕاپەرينی كوردەكان ساڵی ١٨٨٠، د. جەليلی جەليل، وەرگێڕانی لە ڕووسييەوە: د. كاوس قـەفتان، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٨٧.
٣٠. ڕۆژنامەگەريی كوردی لە عێراقدا، فاروق عەلی عومەر، و: تـاريق كـارێزی - عەبدوڵلاْ زەنگەنـە، دەزگای چاپ وبلاْوكردنەوەی موكريانی، هەولێر، ٢٠٠١ .
٣١. ڕۆژی كورد، بلاْوكردنەوەی: جەمال خەزنەدار، چاپخانەی (المؤسسة العراقية)، بەغدا، ١٩٨١.
٣٢. زانايانی كورد، محەممەد ساڵح ئيبراهيمی، ناشر — چاپەمەنی سەقز (محەمەدی)، تاران، ١٣٧٩.
٣٣. زانستی ئاوەڵواتا، د. كامل حسن البصير، چاپخانەی كۆڕی زانياری عێراق، بەغدا، ١٩٨١.
٣٤. زمانەوانی، محمد معروف فتاح، (دار الحكمة للطباعة والنشر)، هەولێر، ١٩٩٠.
٣٥. زمانناسیو هەندێ بابەتی زمانناسی كـوردی، سـەلام نـاوخۆش بـەكر، چاپخانەی ژين، هـەولێر، ٢٠٠٤.
٣٦. ژيانو بەسەرهاتی عەبدولرەحمانی زەبيحی، عەلی كەريمی، چاپخانەی كاربين، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٣٧. ژين — گۆڤارا كوردی — تركی، م. ئەمين بۆر ئەرسەلان، جلد ١ — ٥، وەشانا دەنگ، سويد، ١٩٨٥.
٣٨. سەروا، د. عەزيز گەردی، دەزگای ئاراس بۆ چاپو بلاْوكردنەوە، هەولێر، ١٩٩٩.
٣٩. سەوداو سنوور، د. احسان فؤاد، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٠.
٤٠. سلێمانی شارە گەشاوەكەم، ب١، جمال بابان، دار الحريە للطباعة، بەغداد، ١٩٩٣.
٤١. سوارەو پەخشانی كوردی، محەممەد بەهرەوەر، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٤٢. سۆسيۆلۆژيای شـيعری كـوردی، ئـازاد عەبدولواحيـد كـەريم، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
٤٣. شرفنامە، هەژار كردويە بە كوردی، چاپخانەی نعمان، نەجەف، ١٩٧٢.
٤٤. شعرو ئەدەبياتی كوردی، ڕەفيق حلمی، مگبعە التعليم العالی، هەولێر، ١٩٨٨.

٤٥. شێواز لە کورتە چیرۆکی کوردیدا، سەلیم ڕەشید ساڵح، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٤٦. عەبدوڵڵا بەگی میسباح – دیوان، د. مارف خەزنەدار، چاپخانەی ئیرشاد، بەغدا، ١٩٧٠.
٤٧. عەرووزی کوردی، نووری فارس حەمەخان، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.
٤٨. فەرمانڕەوایی موکریان، محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، دار الحريه للطباعة، بەغدا، ١٩٩٢.
٤٩. کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥.
٥٠. کوردستانی موکریان، حسين حزنی، مطبعةی زاری کرمانجی، رواندز، ١٩٣٨.
٥١ . کوردو عەجەم، صالح محمدامين، چاپخانە؟، چ١، شوێنی چاپ ؟، ١٩٩٢.
٥٢. کوردو کوردستان، نیکیتین، وەرگێڕ: خالیدی حسامی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٧.
٥٣. کوردو کوردستان، محمدامين زكی، انتشارات سيديان مهاباد، چاپخانەی دار السلام، بەغدا، ١٩٣١.
٥٤. کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، حامید گەوهەری، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.
٥٥. کۆ وانەکانی کێش ناسی، م. محمد بەکر، قۆناغی بەکالۆریوس، هەولێر، ١٩٩٣.
٥٦. کێشەی کورد، لازاریف، بەشی ١-٢، د.کاوس قەفتان لە رووسییەوە کردویە بە کوردی، مطبعة الجاحظ، بەغدا، ١٩٨٩.
٥٧. کێش‌و ریتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی، د. محەمەد بەکر، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.
٥٨. کێش‌و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی، عبدالرزاق بيمار، چاپخانەی (دار الحريه)، بەغدا، ١٩٩٢.
٥٩. کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، عەزیز گەردی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٩.
٦٠. گۆڤاری نیشتمان، جەمال نەبەز، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید، ١٩٨٥.
٦١. مهابادو کورتە مێژوویەك، عومەر باڵەکی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٤.
٦٢. میدیا، دیاکۆنوف، برهان قانع لە فارسییەوە کردویەتی بە کوردی، دار الحرية للطباعة، بەغدا، ١٩٧٨.
٦٣. مێژووی ئەدەبی کوردی، علاوالدين سجادی، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٧١.
٦٤. مێژووی ئەدەبی کوردی، د. مارف خەزنەدار، ب١-٧، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١ – ٢٠٠٦.
٦٥. مێژووی کورد لەسەدەی نۆزدەو بیست دا، کریس کۆ چێرا، وەرگێڕاوی – محەمەد ریانی، چاپخانەی (صدف)، تاران، ١٣٦٩.
٦٦. مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، صالح قەفتان، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)، بەغدا، ١٩٦٩.

٦٧. ناسیونالیزمی کوردی (١٨٨٠ – ١٩٣٩)، هیوا عەزیز سەعید، بلاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٣.
٦٨. نالیو زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، کەریم شارەزا، چاپخانەی (الادیب)، بەغدا، ١٩٨٤.
٦٩. هەواری خاڵی – سەرجەمی نووسینی هێمن، بەسەرپەرشتی: بەدران ئەحمەد – عوسمان دەشتی، دەزگای چاپو بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٣.
٧٠. هونەری شیعر، ئەرەستۆ، وەرگێڕانی: عەزیز گەردی، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤.
٧١. هێمن – لە بارەی ناوەڕۆکی سیاسیو کۆمەڵایەتی شیعرەکانی، عوسمان دەشتی، چاپخانەو ئۆفیستی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٣.
٧٢. وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانسی کوردی دا، عەبدولقادر محەمەد ئەمین، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

**ب. بە زمانی عەرەبی:**

٧٣. الاكراد – ملاحظات وانطباعات، مينورسكي، ترجمة: الدكتور معروف خزنەدار، مطبعة النجوم، بغداد ١٩٦٨.
٧٤. البيتوشي، محمد الخال، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٥٨.
٧٥. الثابت والمتحول (صدمة الحداثة)، ادونيس، دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع، بغداد، ١٩٨٦.
٧٦. الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن، الدكتور عبدالستار طاهر شريف، شركة المعرفة للنشر والتوزيع، بغداد، ١٩٨٩.
٧٧. اللغة والفكر، الدكتور نوري جعفر، مكتبة النوحي، الرباط، ١٩٧١.
٧٨. النقد الادبي الحديث، الدكتور محمد غنيمي هلال، دار العودة، بيروت، ١٩٨٧.
٧٩. بنية الايقاع في الخطاب الشعري، د. يوسف اسماعيل، مطابع وزارة الثقافة، دمشق، ٢٠٠٤.
٨٠. بنية اللغة الشعرية، جان كوهن، ترجمة: محمد الولي ومجهد العمري، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، ١٩٨٦.
٨١. تاريخ الادب العربي – العصر الجاهلي، دكتور شوقي ضيف، دار المعارف بمصر، القاهرة، ١٩٦٠.
٨٢. تحليل النص الادبي بين النظرية والتطبيق، محمد عبدالغني المصري ومجد محمد الباكير البرازي، مؤسسة الوراق للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٢.
٨٣. دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، الدكتور كمال مظهر احمد، مطبعة اركان، بغداد، ١٩٨٥.
٨٤. شعر عمر بن الفارض – دراسة اسلوبية، رمضان صادق، مطابع الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٨.
٨٥. فنون الشعر الفارسي، دكتورة اسعاد عبدالهادي قنديل، مكتب الشريف وسعيد رافت للطباعة والنشر والتوزيع، القاهرة، ١٩٧٥.
٨٦. قافلة من شهداء كردستان ايران، كريم حسامي، ترجمة: نزار محمود، بغداد، ١٩٧٣.
٨٧. قضايا الشعر المعاصر، نازك الملائكة، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٦٢.
٨٨. مقالة في اللغة الشعرية، محمد الاسعد، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ١٩٨٠.

٨٩. موسوعة نظرية الادب — الشعر الغنائي، سكفوزينكوف، ترجمة: الدكتور جميل نصيف التكريتي، مطبعة وزارة الثقافة والاعلام، بغداد، ١٩٨٦.

**جـ. بەزمانی فارسی:**

٩٠. ادوار شعر فارسی، دکتر محمد رضا شفیعی کدکنی، توس، تهران، ١٣٣٥.

٩١. ایرانی که من شناختەأم، ، ب ـ نیکیتین،ترجم علی محمد فرەوشی، ناشر: کانون معرفت، تهران، ١٣٢٩.

٩٢. تاریخچه خانواده قاضی در ولایت موکری، خلیل فتاح قاضی، تبریز، ١٣٧٨.

٩٣. تاریخچه روزنامه های تبریز أر صدر مشروطیت، عبدالحسین ناهیدی آذر، موسسه انتشارات تلاش، تبریز، سال چاپ: ؟.

٩٤. تاریخ فرهنگ وادب مکریان، ابراهیم افخمی، ٢ جلد، انتشارات محمدی، سقز، ١٣٧٣.

٩٥. تاریخ وجغرافیای کردستان (سیر الاکراد)، عبدالقادر ابن رستم بابانی، چاپخانەی ارژنگ، ١٣٦٦.

٩٦. تاریخ مهاباد، سید محمد صمدی، انتشارات رهرو مهاباد، چاپ میلاد، ١٣٧٧.

٩٧. جغرافیای طبیعی کردستان مکریان، سعید حجری، انتشارات ناقوس، سنندج، ١٣٧٩.

٩٨. خاطرات دکتر هاشم شیرازی، به کوشش هاشم سلیمی، انتشارات توکلی، تهران، ١٣٨٠.

٩٩. دربارەء ادبیات ونقد ادبی، دکتر خسرو فرشید ورد، جلد دوم، مؤسسه انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٧٨.

١٠٠. زبانشناسی ونقد ادبی، راجر فالر — رومن یاکوبسن، ترجمه: مریم خوزان — حسین پاینده، چاپ مهدی، تهران، ١٣٨١.

١٠١. زندگینامەی عارف ربانی — شمس الدین برهانی، ابو بکر خواچه سپهرالدین، انتشارات صلاح الدین ایوبی، ارومیه، ١٣٦٨.

١٠٢. زیباشناسی سخن پارسی — بدیع، میر جلال الدین کزازی، کتاب ماد، تهران، ١٣٨١.

١٠٣. سالهای اضطراب — خاطرات خلیل فتاح قاضي، انتشارات صلاح الدین ایوبی، ارومیه، ١٣٧٠.

١٠٤. سبك شناسی شعر، دکتر سیروس شمیسا، نشر میترا، تهران، ١٣٨٣.

١٠٥. شاعران کرد پارسی گوی، سید عبدالحمید حیرت سجادی، نشر احسان، تهران، ١٣٧٥.

١٠٦. شعرنو، محمد حقوقی، ٢ جلد، نشر یوشیج، تهران، ١٣٧٧.

١٠٧. صور خیال در شعر فارسی، دکتر محمد رضا شفیعی کدکنی، موسسة انتشارات آگاه، تهران، ١٣٨٠.

١٠٨. کردها و یك بررسی تاریخی وسیاسی، حسن ارفع، ترجمه ازمتن انگلیسی، لندن، چاپ دانشکده اکسفورد، نیویورك، ١٩٦٦.

١٠٩. کلیات سبك شناسی، دکتر سیروس شمیسا، نشر میترا، تهران، ١٣٨٤.

١١٠. گلزار شاعران کردستان، سید عبدالحمید حیرت سجادی، چاپخانەی رامین، تهران، ١٣٦٤.

٢. گۆڤــــار

أ. بە زمانی کوردی

١١١.نۆرژینالّی ژمارە (٢)ی (هتاوکرد)، عەبدوڵلاّ زەنگەنە، گـ رۆژنامەنووس، ژ- ٩ ،٢٠٠٦ .

١١٢. بەرگری لە هەڵبەست، کامل ژیر، گ — رۆشنبیری نوێ، ژ-١٣٦، هاوینی ١٩٩٠.

١١٣. پێشرەوانی شیعری نوێ لە رۆژهەڵاتی کوردستان، جوان بۆکانی، مانگنامەی (پەیام)، ژ-١٠، لەندەن، ١٩٩٨.

١١٤. تەئسیری زمان و ئەدەبی فارسی لەسەر ئەدەبی کوردی، د.محەمەد نوری عارف، گـ کۆلیجی ئەدەبیات، زانستگای بەغدا، ژ-٨، ١٩٧٤.

١١٥. چاوگی "بوون"و "هەبوون" لە زمانی کوردیدا، نوری عەلی ئەمین، گـ رۆشنبیری نوێ، ژ — ١٠٩، ئاداری ١٩٨٦.

١١٦. دانشتنێك لەگەڵ گۆران، عبدالرزاق بیمار، گـ بەیان، ژ-٢، شوباتی ١٩٧٠.

١١٧. دوو رۆژنامەی (کوردستان) لە ئەستەمبوول، د. مارف خەزنەدار، گـ رۆژی کوردستان، ژ- (٤٣-٤٤)، زستانی ١٩٧٧.

١١٨. رەوتی سەرهەڵدانی شێعری نیشتمانیو سیاسی لە موکریان، س.ج. هێرش، گـ گزینگ، ژ.(١٣ — ١٥)، پایزی ١٩٩٦.

١١٩. زاراوەکانی زمانی کوردیو زمانی ئەدەبیو نووسینیان، کمال فؤاد، گـ زانیاری، ژ-٤، بەغدا، سەرماوەزی ١٩٧١.

١٢٠. شاعیرانی کوردو ئەدەبیاتی فارسی، ئەمین موتابچی، گـ کۆلیجی ئەدەبیات، ژ-١٦، ١٩٧٣.

١٢١. شیعری کوردی، سیاسەت — کۆمەڵایەتی — کوردایەتی، د.مارف خەزنەدار، گ — رۆشنبیری کوردستانی، ژ- ١، ت٢، ١٩٩٩.

١٢٢. شێخ بابا — شێخی شەهید، سەید سمایلی بەرزنجی، گ — مهاباد، ژ — ٩، سەرماوەرزی ١٣٨٠.

١٢٣. لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی یەوە، عەلی رێبوار، گ/ سروە، ژ/ ٨٦، خەرمانان، ١٣٦٥.

١٢٤. مەلا مارفی کۆکەیی، کەمال کۆکەیی، گ/ سروە، ژ/ ٢٥، گەلاوێژ، ١٣٦٧.

١٢٥. هەتاوی کوردو سەردەمی راپەڕین، محمود زامدار، گ — کاروان، ژ- ٥٣، مارت ١٩٨٧.

١٢٦. هەڵوەستەیەك لە ئەدەبیاتی هاوچەرخی رۆژهەڵاتی کوردستان، سامان حوسەینی، گ — بیری نوێ، ژ — ١٨، ١٩٩٧.

ب. بە زمانی عەرەبی:

١٢٧. نالی، مؤسس الادب الكردي الحديث في كردستان الجنوبية، الدكتور معروف خەزنەدار، مجلة شمس كردستان، العدد (٥ -٦)، ايلول — تشرين الثاني ١٩٧١.

جـ. بە زمانی فارسی:

١٢٨. كوكەنی شاعر از يادها محو شده، مهرداد راميدى نيا، نشريه رصيد، شماره (٦٤٦ — ٦٥٦)، (آذرماه — دى ماه)، ١٣٨٠.

. نــامەی ئەكادیــمی

١٢٩. دیلان و تاڤیكردنەوەی شیعری، نامـەی دكتۆرا، دلـشاد عـەلی محەمـەد، كۆلیجی ئاداب، زانكۆی سەلاحەدین، ١٩٩٦.

١٣٠. نوێكردنـەوەی شیعری كوردی لـە سالّی ١٩٣٢ تـا كۆتـایی ١٩٤٩ لـە كوردسـتانی عێراقـدا، نامـەی ماستەر، حوسێن غازی كاك ئەمین، كۆلیجی پەروەردەی ئیبن روشد، بەغدا، ٢٠٠٥.

١٣١. هـاودەنگ لـە زمـانی كوردیـدا، نامـەی ماسـتەر، فتـاح مامـە علـی، كـۆلیجی ئـاداب، زانكـۆی سەلاحەدین، ١٩٨٩.

٤. فەرهــەنگ

١٣٢. فرهنگ اصطلاحات ادبي، سیماداد، انتشارات مروارید، چاپ دوم، ١٣٨٣.

١٣٣. فرهنگ عمید، دو جلد، حسن عمید، مؤسسه انتشارات امیر كبیر، چاپ سوم، ١٣٦٠.

١٣٤. فرهنگ فارسی، ٦ جلد، دكتر محمد معین، مؤسسة انتشارات امیر كبیر، تهران، ١٣٦٠.

١٣٥. المنجد في اللغـة والاعـلام، المطبعـة الكاثوليكيـة، الطبعـة السابعة والعـشرون، دار المشرق، بـيروت، ١٩٨٦.

١٣٦. هەنبانە بۆرینە، هەژار، چ١، سروش، تهران، ١٣٦٩.

٥. نــامەی تایبــەتی

١٣٧. دكتۆر مستەفا "شەوقی" قازی زادە، سەید نجم الدینی ئەنیسی، مهاباد، لە ٢٠٠٥/١٢/٥.

١٣٨. لە بابەت مێژووی لە دایك بوون و كۆچ كردنـی مـەلا مـارف دا، عەبـدوللا سـەمەدی، مهابـاد، لـە ٢٠٠٦/٤/٩.

٦. دیــدارو چاوپێكــەوتن

١٣٩. مستەفای كۆكەیی، مهاباد، لە ٢٠٠٥/٩/٢٧.

١٤٠. سید عبداللەی سەمەدی، مهاباد لە ٢٠٠٥/٩/٢٨.

١٤١. رەحمانی میسباح/ مهاباد لە ٢٠٠٥/٩/٢٨.

١٤٢. كاك ئەحمەدی قازی، مهاباد لە ٢٠٠٥/٩/٢٩.

١٤٣. یونسی رەزایی، بۆكان لە ٢٠٠٥/٩/٣٠.

٧. ئینتــەرنـێت

١٤٤. برا بیری چرایێكی بكەن تاریكە شەو دادێ، عەبدوللا سەمەدی، www.dengekan.com

١٤٥. ناودارانی موكریان، عەبدوللا سەمەدی، www.dengekan.com

فتح - سواره - چاوه
وەفا - هێژا
حەقیقی - خاڵە مین - سەید کامیل
هێمن - هەژار - هێدی - نووری
مەلا مارف - سەیفی قازی - شەوقی
وەفایی
(١٨٤٤ — ١٩٠٢)
حەریق
(١٨٥٦ — ١٩٠٩)
ئەدەب
(١٨٥٩ — ١٩١٦)
ئەحمەدی کۆر
(١٧٧١ — ١٨٨٦)
مەجدی مەلیکولکەلام
(١٨٢٩ — ١٨٧٥)
ئەدیب
(١٨٧٤ — ١٩٣٣)
موکریان
سالی سنە
(١٨٤٥-١٩٠٩)
ئەردەلان
مەحوی
(١٨٣٠-١٩٠٤)
سلێمانی
حاجی
(١٨١٥-١٨٩٧)
سۆران
شێخ ڕەزا
(١٨٣٥-١٩٠٩)
گەرمیان
سالم
(١٨٠٥ — ١٨٦٩)
نالی
(١٨٠٠ — ١٨٧٣)
کوردی
(١٨١٢ — ١٨٥٠)
قوتابخانەی شیعری کرمانجی خواروو

## شەجەرەی بنەماڵەی سەیفی قازی و مستەفا شەوقی (*)

---

* بە کورتەی زانیارییەکانی ناو کتێبی (تاریخچە خاندانە قاضی در ولایت موکری) رێکخراوە.

# له بلاوكراوەكانی مەڵبەندی كوردۆلۆجی

## بەرهەمی نووسین

١-فەرهەنگی رێزمانی كوردی، د. كەمال میراودەلی.

٢- فەرهەنگی زەویزانی، جەمال عەبدول.

٣-حركات الخوارج فی غربی إقلیم الجبال وشهرزور والجزیرة الفراتیة:عطا عبدالرحمن محي الدين.

٤- سۆفیزم و كاریگەریی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی كورددا: ١٨٨٠- ١٩٢٥، د. جەعفەر عەلی

٥-قـضـا، هەڵـەبجـە، دراسە فی الجغرافیە الإقلیمیە: عطا محمد علاءالدین.

٦-رۆڵی هۆكـــارە سیاســـییەكان لە دابەشبوونی دانیشتوانی پارێزگای سلێمانیدا: جاسم محەمەد محەمەد

٧-پەیوەندییە سیاسییەكانی نێوان هەرێمی كوردستان و توركیا، ١٩٩١-١٩٩٨: هێرش عەبدوڵلا حەمەكەریم.

٨-رۆژنامەگەریی خوێندكارانی كورد لە ئەورووپاو ئەمریكا، ١٩٤٩-١٩٩١ ، ئەوزاد عەلی ئەحمەد.

٩-هوشیاری كۆمەڵایەتی، فواد تاهیر سادق

١٠-شاری سلێمانی ١٩٣٢-١٩٤٥ ، د. ئاكۆ عەبدولكەریم شوانی.

١١-إقلیم كوردستان العراق في دائرة السیاسات النفطیة العالمیة، د. محمد رؤوف سعید مهندس زمناكو سعید

١٢-بەعەرەبكردن لە هەرێمە كوردنشینەكاندا ٦٣- ٨٤٧ ز، رحیم ئەحمەد ئەمین

١٣-تعریب قضاء خانقین من منظور جیوسیاسي، صلاح الدین انور قیتولي

١٤-كۆیە، كامەران طاهر سەعید

١٥-بوون لە شیعری مەحویدا، د.محەمەد ئەمین عەبدوڵلا

١٦-شێواز لە شیعری كلاسیكیی كوردیدا، حەمە نوری عمر كاكی

١٧- ئەرمەنۆساید، مامەند رۆژە

١٨-كولتوور و ناسۆنالیزم، د. رەفیق سابیر

١٩- بنیاتی كارنامەیی لە دەقی نوێی كوردیدا، د. عبدالقادر حمە امین محمد

٢٠-رستەی باسمەند لە زمانی كوردیدا، كاروان عومەر قادر

٢١- جیۆگرافیای باشووری كوردستان، د. عەبدوڵلا غەفوور

٢٢-دابەشبوونی دانیشتوانی شاری هەولێر، فاتیمە قادر مستەف

٢٣- ئیدیۆم چەشنو پێكهاتنی لە زانی كوردیدا، شیلان عومەر حسەین

٢٤-شیعری ناوچەی موكریان ، د. عوسمان دەشتی

25/Report on the Sulaimani District of Kurdistan، E.B. Soane.

## بەرهەمی وەرگێران

١-كۆمەڵكوژییەكەی دەرسیم، حوسێن یڵدرم، لە سوێدییەوە: كاوە ئەمین.

٢-جەنگی عێراق، كاپلان و كریستل، لە ئینگلیزییەوە: عەبدولكەریم عوزێری.

٣-یاسا دەستوورییەكانی توركیا و كورد لە سەردەمی نوێدا، م. ئە. حەسرەتیان، لە روسییەوە: د. دلێر ئەحمەد

٤-سلێمانی ناوچەیەك لە كوردستان، ئی.بی. سۆن، لە ئینگلیزیەوە: مینە.

٥- شەرەفخانی بەدلیسی- سەردەم، ژیان، ئەمریی، ئیڤگێنیا ڤاسیلیێڤا، لە روسیەوە: د.ئارام عەلی

- ❖ گۆڤاری كوردۆلۆجی، ژمارە یەكی ساڵی ٢٠٠٨
- ❖ گۆڤاری كوردۆلۆجی، ژمارە دووی ساڵی ٢٠٠٩